

زنجیرە چیرۆکی ئاکارە جوانەکان
ئەو کەروێشکەی
منتدى إقرأ الثقافي
لە چیاکە زویربوو
www.iqra.ahlamontada.com
گوڵنار گوللوئۆڵو
İRFAN
PUBLISHING
٦




# ئەو کەروێشکەی لە چیاکە زویربوو

گوڵنار گوللوئۆڵو



زنجیرە چیرۆکی ئاکارە جوانەکان - ٦

# ئەو کەروێشکەی لە چیاکە زویربوو

نووسینی: گوڵنار گوللوئۆڵو
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: شوبات - ٢٠١٤
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0)750 713 80 00



# دەریاچە سەوزەکە

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. لە دێر زەماندا دەریاچەیەک هەبوو پڕ بوو لە ماسی جۆراوجۆر. چواردەوری ئەم دەریاچەیە هەموو بە درەختی بەرز و لق و پۆپ درێژ دەورە درابوو. هەربۆیە ڕەنگی سەوزێکی تۆخی دەنواند. لەبەر ئەوە خەڵکی پێیان دەوت دەریاچە سەوزەکە.

لەگەڵ ئەوەی دەریاچەکە پڕ بوو لە ماسی هەمەڕەنگ، کەچی مرۆڤەکان نەیاندەتوانی ڕاوەماسی تێدا بکەن. سەرەڕای بەکارهێنانی چەندین جۆری قولاپ و تۆڕ و دانە ماسی، کەچی هەر سەرکەوتوو نەبوون لە کارەکەیاندا. لە زستانانداندا چینی سەرەوەی دەریاچەکە دەیبەست. مرۆڤەکان ئەمەیان بە هەل دەزانی و لە دڵی خۆیاندا دەیانوت هەرچۆنێک بێت ئێستا ماسییەکان برسییانە، هەربۆیە لەچەند شوێنێکی دیاریکراودا چینە بەستووەکەیان دەبڕی و قولاپیان لێوە شۆڕ دەکردەوە. بەڵام دیسانەوە بەدەست بەتاڵی دەگەڕانەوە و ماسییان بۆ ڕاونەدەکرا.



لە ڕاستیدا لە هۆکاری ئەوە تێنەدەگەیشتن کە بۆچی لە ئێستادا ڕاویان پێناکرێت، لەکاتێکدا چەند ساڵێک لەمەوبەر دنیایەک ماسی جوانیان ڕاوکردبوو. بەر لە دوو ساڵ زریانێکی بەهێز لەو ناوچەیەدا هەڵی کردبوو. زریانەکە ئەوەندە بەهێزبوو، تەنانەت پەرژینی خانوو و کولانەکانیشی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو وبردبوونی بە هەوادا. زیندەوەرە ئاوییەکانیش بێبەش نەبوون لەمە. زریانەکە ماسی هەندێ دەریاچەشی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو و بردبوونی بۆ شوێنێکی تر. تومەز دەریاچەکەی ئێمەش کۆمەڵێک ماسی نوێی بۆ هاتبوو کە هەموویان خوێندکاری زانکۆ بوون.





جا لەبەر ئەوەی ماسییە نوێیەکان ڕۆشنبیر بوون و ئاستی زانستییان بەرزبوو، بۆیە ئاگاداری سەرجەم پێشکەوتنەکانی مرۆڤ بوون لە بواری ڕاوەماسیدا. دەیانزانی مرۆڤەکان بە چ جۆرە قولاپێک و چ جۆرە دانێک و بە چ شێوازێک ماسی ڕاودەکەن.



بەمجۆرە، لەگەڵ هاتنیاندا بۆ دەریاچە سەوزەکە، یەکسەر دەستیان کرد بە وانە وتنەوە بە ماسییەکانی تر. یەکە یەکەی دانیشتوانی دەریاچەکەیان فێری ئەو ڕێوشوێنانە کرد کە دەبوو لە زستان و هاویندا بیگرنەبەر.



جا ئیتر ئازیزان لەپاش ئەوەی ڕاوچییەکان ئومێدیان بڕی لە ڕاوکردن، ماسییەکان ئەم بارودۆخەیان پێکەوت و ئەوەندە قەڵەوبوون، دەتووت فویان تێکراوە. تەنها حاجی لەق لەق و هەڵۆکان بوون کە دەیانتوانی لە دەریاچەکەدا ماسی ڕاو بکەن. ڕاوچییەکانیش کە ئەمەیان دەبینی، ئەوەندەی تر دڵگران دەبوون و دەیانوت ئێمە چیمان لەو گیاندارانە کەمترە وا ناتوانین ڕاوبکەین!



ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆی. ئیتر ماسییە خوێندەوارەکان بینییان وا هەموو ماسی دەریاچەکە فێربوون چۆن ڕاونەکرێن، بۆیە کۆتاییان بە وانە وتنەوە هێنا. بەڵام ماوەیەک دوای نەمانی وانەکان، ڕاوچییەکان شێوازی تریان دۆزییەوە و لەڕێی بەکارهێنانی قولاپێکی نوێوە دەستیان کردەوە بە ماسی گرتن.



کاتێک ئەم هەواڵە گەیشتەوە ماسییە خوێندەوارەکان، دەستوبرد لەناو خۆیاندا کۆ بوونەوە و دەستەیەکی بەدواداچوونیان پێکهێنا. ئەم دەستەیە هەستان بە سەردانکردنی ئەو ماسییانەی لە قولاپ ڕزگاریان ببوو و بریندار بوون. ئینجا بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری، دوو ماسی چاونەترسیان هەڵبژارد و ناردیانن بۆ سەر ئاوەکە. ئەمانیش چوون گوێبیستی گفتوگۆی ئەو ڕاوچیانە بوون کە بە شێوازە تازەکە ڕاویان دەکرد. سەرەنجام شارەزای کون و کەلەبەری شێوازی ڕاوکردنەکە بوون و بە کۆمەڵێک زانیارییەوە گەڕانەوە.



بێگومان ئەم هەوڵەی ماسییەکان سەری گرت و پاش ماوەیەک شێوازە تازەکەش سوودی نەما. لەدوای ئەمە ڕاوچییەکان وا بیریان دەکردەوە کە هەرگیز ناتوانن لە دەریاچەکەدا ماسی بگرن. تەنانەت هی وایان هەبوو بانگەشەی ئەوەی دەکرد دەریاچەکە سیحراوییە. بەم هۆیەوە چەندین ساڵ لەسەریەک دەریاچەکە ڕاوەماسی بەخۆیەوە نەبینی.



وەک هەموو زیندەوەرێکی تر دواجار ماسییە خوێندەوارەکانیش پیر بوون وماڵئاواییان لە دنیا کرد. ئیتر کەس نەما لە دەریاچەکەدا زانیارییەکان بگوازێتەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو، بۆیە ڕاوچییەکان وردە وردە کەوتنەوە ڕاوە ماسی. لەکۆتاییدا نهێنی دەریاچەکە کۆتایی پێهات و دەریاچە سەوزەکەش وەک هەموو دەریاچەکانی تری لێهاتەوە.



سەرەنجام ڕۆژە خۆشەکانی دەریاچە سەوزەکەش بوون
بە ئەفسانە و لەناو ماسییەکاندا دەما و دەمی پێدەکرا.



# ئەو کەروێشکەی لە چیاکە زویربوو

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. چیایەک هەبوو مەزن و بڵند بوو. قەدپاڵەکانی ئەم چیایە هەمووی لەوەڕگای سەوز و جوان بوو. لەوسەری لەوەڕگاکانیشەوە دارستانێکی چڕوپڕی لێبوو. درەختەکانی ئەم دارستانە هەموو پیر و بەساڵاچووبوون. لە پشتی دارستانەکەشەوە لوتکەی چیا بەرزەکە دەبینرا، کە زۆربەی کاتەکانی ساڵ لەناو هەوردا ون بووبوو. لەم لەوەڕگایانەشدا سەدەها کەروێشکی جوان و نازدار قونە قونیان دەهات و ژیانیان دەبردە سەر.



کاتێک کەروێشکەکان هەستیان بە برسێتی دەکرد، لە لانەکانیان دەهاتنە دەرەوە و دەستیان دەکرد بە گیاخواردن. ئەوانەش حەزیان لە شلیک بووایە، دەچوونە کەناری دارستانەکە و بەدڵی خۆیان شلیکیان دەخوارد. هەموو گیاندارانی دارستان پێکەوە بە ئاشتی و خۆشی دەژیان. چیا مەزنەکەش کە بڵندترین چیای ناوچەکە بوو لەگەڵ ئەو گیاندار و درەختانەی لەسەری دەژیان بەوپەڕی ئاسوودەییەوە ژیانی دەگوزەراند.



ڕۆژێکیان یەکێک لەو کەروێشکانەی لە نزیک دەشتاییەکەدا دەژیا بە جۆش و خرۆشەوە ڕووی کردە هاوڕێکانی و وتی:

- هاوڕێیان، من دەمەوێت لەگەڵ ئەم چیا مەزنەی وا لەسەری دەژین، ئاشنایی زیاتر پەیدا بکەم و لەگەڵیدا ببمە هاوڕێی گیانی بەگیانی.



هاوڕێکانیشی بەسەرسوڕمانەوە لێیان پرسی:

- جا با بڵێین ئەوە بوونە هاوڕێش، چی لە مەسەلەکە دەگۆڕێت؟ ئەوە نییە بۆخۆمان لەسەری دێین و دەچین و ڕادەکەین و دەخۆین و تێر یاری دەکەین؟ دەتەوێت بەم خۆ نزیککردنەوەیە چیت دەست بکەوێت؟



- قابیلە چی دەبێت! دەچم بۆخۆم شوێنی باشترین و بەتامترین شلیکەکانی لێدەپرسم. هەروەها پرسیاری ئەوەشی لێدەکەم کە لە چ شوێنێکدا دەتوانین لانەی باشتر دروست بکەین.



هاوڕێکانی پێیان وت:
- باشە، بەڵام خۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە ڕوون و ئاشکران. باو و باپیرانیشمان کە یەکەمجار هاتونەتە ئێرە وەڵامی ئەم پرسیارانەیان لە چیا مەزنەکەوە دەستکەوتووە، پاشان بارگە و بنەیان داناوە.

کەروێشکە خرپن گوێی بە قسەی هاوڕێکانی نەدا و سوور بوو لەسەر بیرۆکەکەی:

- وی کە سەیرە، بەڕاستی ئێوە هیچ هەستێکی لێکۆڵینەوەتان تێدا نییە! باشە کێ ناڵێت شوێنی لێرە خۆشتر و سەوزایی و چیمەنی جوانتری لێ نییە. چ لەوە باشتر هەیە بەدوای شتی نوێدا بگەڕێیت؟!

بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ چیا مەزنەکەدا کەروێشکە زیتەڵ دارستانەکەی بەجێهێشت و ملی ڕێگەی گرتەبەر. گەیشتن بە چیا مەزنەکە کارێکی هەر وا ئاسان نەبوو. بۆیە لە گەشتەکەیدا دووچاری تینوێتی و برسێتی زۆر هات.





هەرکات برسی بووایە بوخچەکەی دەکردەوە و شتێکی دەخوارد. لەکاتی تینوێتیشدا لە ئاوی سازگاری کانییەکانی دەخواردەوە و بەسەر پێیی دەکەوتە دەمەتەقێ لەگەڵ ئەو گیاندارانەی لەسەر ڕێ دەیبینین و باسی ئامانجی گەشتەکەی بۆ دەکردن. ئیتر ئەم گیاندارانەش هەندێکیان بە پێکەنینەوە دەیاندا بەلایدا و هەندێکی تریشیان بە سەرسووڕماویەوە تەماشایان دەکرد. ئیتر ئەوەبوو لە کۆتاییدا کەروێشکی هاوڕێمان گەیشتە چیاکە.



لەو کاتەدا کە خرپنی هاوڕێمان
گەیشتە دامێنی چیاکە، چیا مەزنەکە ڕووی
کردبووە خۆر و خەریکی گەرمکردنەوەی ئەو لایەی بوو
کە سەرمای ببوو. گەورەیی چیاکە ترسێکی زۆری خستە دڵیەوە.
بەڵام ورەی دایە بەرخۆی و کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ چیا مەزنەکەدا:
- سڵاو ئەی چیای مەزن، چۆنی؟
چیاکەش بە دەنگە گڕەکەی خۆی وەڵامی دایەوە و وتی:
- سڵاو لە تۆش ئەی کەروێشکی بچکۆلانە. سوپاست دەکەم، ئەی
تۆ چۆنی؟


- هینه... من هاتووم بۆ سەردانی ئێوە. چونکە داواکارییەکم لێتان هەیە.
- ئادەی کەروێشکی خنجیلانە، بڵێ بزانم چیت دەوێت؟!
- لە ڕاستیدا من بەدوای جێگەیەکی خۆشتردا دەگەڕێم بۆ نیشتەجێبوونی وەچەکانم. جا بۆیە هاتووم تا بزانم ئەگەر شوێنێکی تر هەبێت کە چیمەن و شلیکی بەتامتری لێبێت!



چیا مەزنەکە بەم داواکارییەی خرپن زۆر سەرسام بوو. لە دڵی خۆیدا دەیوت باشە خۆ من چەند ساڵێک لەمەوبەر باشترین شوێنم پیشانی باو و باپیرانی ئەم گوێ قوتە دابوو. هەبێ و نەبێ ئەم خەپەیە بزێوە و ئیشی لەخۆی گەورەتر دەکات. جگە لەمە، بە دەموچاویشیدا دیارە کە بێ پرسی گەورەکانی هاتووە.



ئینجا چیا مەزنەکە چەند ئامۆژگارییەکی گرنگی پێشکەش بە کەروێشکی هاوڕێمان کرد:

- هاوڕێ بچکۆلەکەم تکایە جوان گوێ بۆ وتەکانم بگرە و بە هەڵە لێم تێمەگە. بەڕاستی زەحمەتت کێشاوە کە تا ئێرە هاتویت، بەڵام بە خوت و خۆڕایی هاتوویت. چونکە وەختی خۆی باشترین شوێنم پیشانی باو و باپیرانت داوە. ئیتر ئەوانیش لەو شوێنە نیشتەجێ بوون. بەڵام دەبینم تۆ کەروێشکێکی زیتەڵ و وریایت. نیشتمانەکەشمان گەورە و فراوانە. ئەگەر حەز و خولیای گەڕانت هەیە، ئەوا مۆڵەت لە گەورەکانت وەربگرە و بەپێی توانای خۆت بگەڕێ.



کەروێشکی زیتەڵیش ئامۆژگارییەکانی چیا مەزنەکەی لەگوێ گرت و دەستی کرد بە گەڕان بە وڵاتدا و چەندین شتی سەیر و سەمەرە و ناوازەی بەرچاو کەوت.

پاش چەندین ساڵ لە گەشت و گەڕان، ئێواران دادەنیشتن و بەسەرهاتەکانی ژیانی بۆ بێچووەکانی دەگێڕایەوە. کەروێشکە وردیلەکانیش هەرگیز لە وتەکانی باوکیان وەڕس نەدەبوون لەبەر ئەوەی هەگبەی چیرۆکی کەروێشکە زیتەڵ هەرگیز چیرۆک و بەسەرهاتی خۆش و سەرنجڕاکێشی لێ نەدەبڕا.

# ئەو کەروێشکەی لە چیاکە زویربوو

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. لە دێر زەماندا شاخێکی مەزن و بەرز هەبوو. هەزارەها کەروێشک لە چەندین لەوەڕگا و قەدپاڵی سەوز و قەشەنگی ئەم چیایەدا دەژیان. سەرجەم گیاندارانی سەرپشتی چیاکە لە ژیان و گوزەرانی خۆیان ڕازی بوون و خۆش دەژیان. بەڵام کەروێشکێکیان حەزی بە گەڕان بوو. هەربۆیە کەوتە گەڕان بەدوای شوێنی باشتر بۆ دروستکردنی کولانە. ئەم کەروێشکە گەنجە گوێی بۆ قسەی گەورەکان شل نەکرد و بەرەو چیاکە ملی ڕێی گرتەبەر. چیرۆکەکەی ئێمەش لێرەوە دەست پێ دەکات. دەی حەزدەکەن پێکەوە بزانین کەروێشکەکە چی لێ بەسەردێت؟





دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+٩٦٤ (٠) ٧٥٠ ٧١٣ ٨٠٠٠









نرخی ٢٠٠٠ دینارە